تەنها بەدیاری دەبەخشرێ

زنجیرە ( ٢ )

# پەیامەکانی بەرەو بەهەشت



باڵاپۆشی

تەبەرروج

تەغریب

ئامادەکرنی
باوکی چیای خولەکان

١٤٣٨ك
٢٠١٦ز

زەنجیرە
(٢)

# پەیامەکانی بەرەو بەهەشت

## (بالاپۆشی – تەبەڕوج - تەغریب)

ئامادەکردن
باوکی چیای خولەکان

١٤٣٨ك -- ٢٠١٦ ز

# ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب: پەیامەکانی بەرەو بەهەشت
کۆکردنەوەی: باوکی چیا خولەکان
دیزاینی ناوەرۆك: باوکی ماکوان
نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم
چاپخانە: (رۆژهەڵات) هەولێر

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارە سپاردنی ( ٦٣٠ )ی
ساڵی (٢٠١٦)ی دراوەتێ

# پێشەکی

پشت بەخودای میهرەبان کە ئێمە چەند ساڵێك بوورنجیرەی بەرەو بەهەشتمان بلاّدەکردەوە، چەند خوێنەرێکی قەدرگران داوایان کرد ئەم بلاّوکراوانە کۆبکرێتەوە لەچەند کتێبێکدا چاپ بکرێ، جائێمەش بەناوی خودای گەورە هەڵساین بەم کۆکردنەوەی چەند ژمارەیەك (کۆنو نوێ)ی زنجیرەکانی بەرەو بەهەشت لەدوو توێی نامیلکەیەك بەناوی چەند پەیامێکی بەرەو بەهەشت و دووبارە زنجیرە بۆ دانانەوەی ، بێگومان تەنهاو تەنها کتێبی خودا بێ هەڵەیەو چاوپۆشی بکەن لەهەڵەکانم دوعام بۆ بکەن خودا لێمی قبول کردبێ، لەکۆتایی لە خودای بالاّ دەست دەپارێمەوە ئەمانەش بەشداری پێ بکات لە ئەجرو پاداشتەکەی. لەوان دایکو باوکمو مامۆستاکانمو خێزانە باشەکەمو مامۆستایانی خولەکانمان بەتایبەتی باوکی (عبدالله)ی عابید و هەموو هاوکارانو یارمەتی دەرانم.

**باوکی چیای خولەکان**

**٢٠١٦**

# بالاّ پۆشی (حجاب)

**الحمد لله رب العالمين ،والصلاة والسلام على خاتم الانبياء والمرسلين وعلى آله وصحبه اجمعين.**

سەرەتا دەبێت ئەوە باش بزانین پۆشاکی هەرەگرنگی ئافرەت پیاوەکەیەتی، قال تعالى ﴿هُنَّ لِبَاسٌ لَكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَهُنَّ﴾ البقرة

لەهەمان کاتدا قەلاّی گەورەی ئافرەت پیاوەکەیەتی، ئەگەر ئافرەت بێ پیاو مایەوە مەرجی زۆری دانا لەمێرد کردنو شوی نەکرد ئەوە بزانە بێ بەرگو پۆشاکە.

ئافرەت رۆڵی شکۆی هەیە، ئوممەت ناتوانێ رۆڵ ببینێ بەبێ تۆی ئافرەت چونکە نیوەی ئوممەتی، ئومەتیش دەهێنێتە بەرهەم بەلەدایك بوونو بێ گومان سەدان کەڵە پیاوی ئەم ئیسلامە هەر ئافرەت هێناوینە مەیدان.

بۆیە کاتێ جوولەکەو خاچ پەرستەکانو بی باوەڕان هەستیان بەم شکۆو قەلا پۆلاینەکرد کەتۆی ئافرەتیو چەند کاریگەریت لەسەر کۆمەڵ هەیە هەوڵیاندا لەم قەلایە دەرتبێننو پۆشاکت لەبەرداکەنن حیجابت لەسەر فرێ دەنو پاشان لادانی شەرم وشەرف.

بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) ئاگاداری توند دەداتو دەفەرمووێ (**أن الدنيا حلوة خضرة وان الله مستخلفكم فيها فينظر كيف تعلمون، فاتقوا الدنيا واتقوا النساء، فان أول فتنة بني اسرائيل كانت في النساء**) **مسلم**.

وقال صلى الله عليه وسلم ( **ماتركت بعدي فتنة اشد على الرجال من النساء** ) **متفق عليه**.

بۆیە ئەو ئافرەتەی دینی لەدەست داوە گەورەترین فتنە دروست دەکات لەسەر پیاوان و دوایی تێك چوونی شیرازەی ئوممەت و کۆمەڵگا.

**شاعیر دەڵێ:**

### (( حیجاب تاجە بۆ سەری هەموو کەسێ ناشێ
### ئاڵای دەوڵەتی ڕەوشتە نەك پارچە قوماشێ))

ئافرەتی ئیماندار ئەگەر دەتەوێ لەدونیا بارانی رەحمەت بێ و لە قیامەتیش بەهەشت و رەزامەندی خودا بەدەست بهێنی ئەوا حیجاب بپۆشە، چونکە حیجاب عیبادەتە وەکو نوێژو رۆژوو عیبادەتن، خوای میهرەبان واجیبی کردووە دەفەرموێ:

﴿ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ ءَابَآئِهِنَّ أَوْ ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَآئِهِنَّ أَوْ أَبْنَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ أَخَوَٰتِهِنَّ أَوْ نِسَآئِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُنَّ أَوِ ٱلتَّٰبِعِينَ غَيْرِ أُو۟لِى ٱلْإِرْبَةِ مِنَ ٱلرِّجَالِ أَوِ ٱلطِّفْلِ ٱلَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا۟ عَلَىٰ عَوْرَٰتِ ٱلنِّسَآءِ ۖ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن

﴿ زِينَتِهِنَّ وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣١﴾ ﴾
النور: ٣١

واتــە: ئــەی محمــد ﷺ بــە ئــافرەتی ئیمانــدار بڵــێ چــاویان بپارێزن...لەتەماشای بێگانە...داوێنی خۆیان بپارێزن لەگوناهو جوانی خۆیـان دەرنەخـەن جگـە لـەوەی کـە دیـارە —دەمو چاوو دەست— با سەرپۆشەکانیان بدەن بەسەر سینەو ملیـان دا جوانیو زینـەتی خۆیـان دەرنەخەن بەتەواوی بۆ هاوسەرەکانیان نەبێ، یان باوکی خۆیان، باوکی مێردەکانیان، یا کـوڕی خۆیـان، یـا براکـانی خۆیـان، یـا برازاکانیـان، یـا خوشکەکانیان، یا ئافرەتێك کە پەیوەندیان هەیە بەیەکەوە، یـا ئەوانـەن کە کەنیزەکانیانن یا ئەوانەی کە لەماڵەکانیان دەژیـن و پێویـستیان بـە ئافرەت نیە (لەبەر پیری یان نەخۆشـی...) یـا خـود ئـەو منداڵانـەی کـە هێـشتا شـارەزاییان لـەئافرەت نییـە، نـابێ ئافرەتـانی ئیمانـدار قاچـیان دەربخەن و پێیـان بـدەن لەزەویـدا (تـا دەنگـی زێـڕو پاوانـەکانیان بـێ) بزانرێ کە زینەدارو زێڕدارن کەواتە هەمووتان ئەی ئیمانداران بـەرەو لای خواو بەدەست هێنـانی رەزامەنـدی خـوا بگەڕێنـەوە بـۆ ئـەوەی رزگـارو سەرفراز بن...

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: " **صنفان من أهل النار لم أرهما بعد : رجال معهم سياط كأذناب البقر يضربون بها الناس ، ونساء كاسيات عاريات مائلات مميلات على رؤوسهن كأسنمة البخت المائلة ، لا يدخلن الجنة ولا**

**يجدنَ ريحها ، وإن ريحها ليوجد من مسيرة كذا وكذا " رواه أحمد ومسلم في الصحيح**

واته: دوو کۆمەڵ هەن لەئاگرن من نەمبینیون کۆمەڵە کەسانێك قامچیان پێیە وەك کلکی چێڵ پێ لەخەڵکی دەدەن، کۆمەڵی دووەم کۆمەڵە ئافرەتانێکن کە رووتن‌و داپۆشراون واتە پۆشتەن‌و پۆشاکیان لەبەردایە بەڵام لەراستیدا رووتن، چونکە جل‌و پۆشاکیکی وایان لەبەر دایە کە تەنکەو لاشەی لەدەرەوەیەو بەلارو لەنجە دەرۆن بەرێگادا سەرنجی خەڵکی بۆ خۆیان رادەکێشن وەسەری خۆیان وەکو پشتی وشتر لێ دەکەن ئەم دوو کۆمەڵەیە ناچنە بەهەشتەوەو بۆنیشی ناکەن هەر چەندە بۆنی بەهەشت ئەوەندە ئەوەندە دەروات.

خوشکی پاکم پاش هەرەس هێنانی کوفر بەرامبەر موسڵمانان لەهەموو جەنگەکاندا ئەم جارە جەنگێکی تریان دەست پێ کردووە ئەویش جەنگی حیجابە ! ! ! هەموو هۆکارو ئامانجێکیان خستۆتە کار بۆ لەناوبردنی حیجاب یا گۆڕینی بەشێوەیەکی —وەکو خۆیان دەڵێن— مۆدێرن لەتەسکی‌و کورتی‌و تەنکی دا، ئەم جەنگە دەستی پێکردووە وەکو (غولاندی سۆلی) خاچ پەرست دەڵێ (حاڵی رۆژهەلات رێك ناکرێتەوە ئەگەر ئەو چەفیەی بەسەری ئافرەتانەوەیە لێ نەکرێتەوەو قورئانی پێ دانەپۆشرێ).

خوشکی ئیماندارم چۆن قبوڵ دەکەی لەم جەنگەدا تۆ سەر بازێکی ترسنۆك بیت یا تۆ دەروازەی شکستی ئەم جەنگە بیت لەرێگای فرێ

دانی حیجابەکەت دوژمن سەربکەوێت و ببیتە پارچە پارچە کردنی ریزی موسڵمانان، خوشکە بەرێزەکەم لەم رووبەرووبوونەوەدا سەربکەوەو هیمەت بەرز بە ئازایانە هاواربکەو بڵێ (حیجابی من عیبادەتە).

بێ گومان کچ باڵا پۆشی خۆی پارێزگاری لێ بکات ئەوا کوڕ ئاواتە خوازی دەبێ پەلەی هێنانی دەکات چونکە سەرتاپای ئەم کچە شەرمو حیشمەتو رێزو پایەدارییە.

کچی سفوریش تاوانبارە ، لەسەر ئافرەتە ببێتە مسۆگەری پاراستنی داوێنی پیاوان نەك هۆیەك بێ بۆ رووخاندنی چونکە لەباری دایە بیپارێزێ بەهۆی باڵاپۆشیەکەی.

ئەگەر دوژمنان لەم جەنگەدا شکستیان خوارد ئەوا کۆتا چەکیان بەکاردێنن ئەویش گۆڕانکاری کردنە لەحیجابی موسڵمانان بۆ ئەوەی لەم گۆڕانکاریەش شکستیان پێ بهێنن ، با بە پێی بەڵگە لەقورئانو فەرمودە مەرجە سەرەکیەکانی حیجاب بناسین.

## مەرجی یەکەم:

## ئەبێ ئەو جلەی لەبەری دەکات هەموو جەستەی داپۆشێ:

دەبێ ئەم پۆشاکە هەموو جەستەی دابپۆشێ جگە لەو شوێنانەی کە خوای گەورە بۆی دیاری کردووە لەئایەتی (٣١) سورەتی النور ئەفەرموێ: ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾ واتە: با جوانیو رازاوەیی خۆیان دەرنەخەن مەگەر ئەوانەی کە دەردەکەون.

زۆربەی زانایان فەرمویانە: مەبەست لەم ئایەتە پیرۆزە (دەستو دەمو چاوە).

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ﴾ سور ٣١ واتە: با لەچکەکانیان شۆڕ بکەنەوە بەسەر کراسەکانیانەوە.

دەبێ ئافرەتان ئەمە بزانن‌و پەیڕەوی بکەن کە لەقورئانی پیرۆزدا ئاماژەیەکی تایبەتی کراوە بە داپۆشینی قژی سەریان و سنگیان بەڵام دەبینین ئافرەتانی ئێمە هیچ گرنگی بە قژیان نادەن لەچکێك لەسەر دەکەن بەڵام نیوەی پرچیان لەدەرەوەیە ئەمەش ناگونجێ لەگەڵ ڕێ‌و شوێنی ئەم ئایینە، ئەسمائی کچی ئەبوبەکر هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) وپۆشاکێکی تەنکی لەبەربوو ئەویش ڕووی لێ وەرگێڕاو پێی فەرموو: (**یا اسماء ان المرأة اذا بلغت المحيض لم يصلح ان يرى منها الا هذا وهذا واشار الى وجهه وكفيه**) **حديث حسن**.

واتە: ئەسماء ئافرەت کەتووشی بێ نوێژی بوو بۆی نییە و دروست نییە هیچ شوێنێکی ببینرێ جگە لەدەمو چاوو هەردوو دەستی.

## مەرجی دووەم

## تەنك نەبوون:

دەبێ ئەم پۆشاکەی ئافرەت لای نامەحرەمدا لەبەری دەکات تەنك نەبێ بەم جۆرەی کە ئەندامی لاشەی لەژێرا دیار بێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ لەم بارەیەوە هەواڵی داوە و فەرمویەتی دوو دەستە لەئوممەتی من هەن نەمدیون: دەستەیەکیان ژنانێکن کە (کاسیات، عاریات) واتە پۆشتەن بەو واتایەی رووتن لەناو پۆشتەن لەو رووەوە کە پۆشاکەکەی تەنکە و ژێرەوەی دیارە.

بوکێك برایە لای دایکە عائیشە (خودا لێیان رازی بێ)، لەچکێکی تەنکی بەسەر درابوو کە پرچی دیار بوو، دایکە عائیشە (خودا لێی رازی بێ) فەرمووی: ( **لم تؤمن بسورة النور إمرأة تلبس هذا** ) واتە: ئەو کەسەی ئەم جۆرە لەچکە لەبەربکات بروای بە سورەتی نور نیە.

هەروەها چەند ژنێك چوونە لای دایکە عائیشە ( خودا لێیان رازی بێ) جلو بەرگی تەنکیان لەبەر دابوو، دایکە عائیشە فەرمووی: ( **إن کنتن مؤمنات فليس هذا بثياب المؤمنات** ) واتە: ئەگەر ئێوە باوەڕدارن، ئەهلی ئیمانن، ئەمە پۆشاکی ژنی بڕوادار نی یە.

## مەرجی سێیەم:
## نابێ بە پۆشاکی پیاوان بچێت یان بەبەرگی ئافرەتانی کافر بچێت.

نابێ ئافرەت پۆشاکێ لەبەر بکات کە لەعورفو عادەتی ئەم کۆمەڵگەیە بە پۆشاکی پیاو ناسرابێت، بۆنموونە پانتۆڵو کابۆو...هتد

لەم بارەیەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی : (**لیس منّا من تشبه بالرجال من النساء، ولا من تشبه بالنساء من الرجال**) (**احمد فی صحیحه**) واتە: ئەو ژنانەی وەك پیاو خۆیان دەنوێنن، ئەو پیاوانەی وەك ژن خۆیان دەنوێنن لەئێمە نین.

مەبەستەکە فراوانترە بە جلو بەرگو هەموو لێکچواندنێك قەدەغە کراوە، هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ (**لعن رسول الله** (ﷺ) **الرجل یلبس لبسة المرأة، والمرأة تلبس لبسه الرجل**).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) لەعنەت و نەفرەت و دوور لەرەحمی خودا — لەو پیاوەی جلی ئافرەت لەبەر دەکاتو لەو ئافرەتەش جلی پیاو لەبەر دەکات.

## مەرجی چوارەم
## تەسك نەبوون:

ئەم پۆشاکە دەبێ پان و فراوان بێ، نابێ تەسك بێت بەرزی و نزمی جەستەی تێیدا دەربکەوێ، ماکسی و بلوزو کراس بۆ ئافرەتان دەبێ شتێکی بەسەردا بکرێت، هەر لەبەر ئەوەشە کە دەبێ لەچکی سەریان بەسەر سنگیان شۆڕ بکەنەوە. هەروەها دەبێ ئافرەتان ئەوە بزانن کە زۆربەی ئەو پۆشاکانەی ئەمڕۆ دێنە بازاڕ لەولاتانی خۆرئاوا دووراون، ڕەچاوی ئەم مەرجەیان تێدا نەکراوە..لەم سەردەمەی ئێستاشدا زۆرێك لەو جلانە کە پێیان دەوترێت حیجاب بەتەسکی دوراون، ناگونجێ بۆ ئافرەتی مولتەزیم بە ئەحکامی ئیسلامی.

ئوسامەی کوڕی زەید گوتی: **كساني رسول الله (صلى الله عليه وسلم) قبطية كثيفة مما أهداها له دحية الكلبي فكسوتها إمرأتي فقال مالك لم تلبس اخاف أن تصف جسم عظمها.** (رواه احمد في المسند ،ج٢، ٢٠٥)

واتە: پێغەمبەر(ﷺ) خوا بەرگێکی وەك جبەی پێ بەخشیم کە تەسك بوو دوحیەی کەلبی بەدیاری پێشکەشی پێغەمبەری (ﷺ) کردبوو، منیش بەخشیمە خێزانەکەم جا پێغەمبەر پێی گوتم بۆچی ئەو جلەت لەبەر نەکردوە منیش گوتم بەخشیمە خێزانەکەم لەبەری بکات فەرمووی بەخێزانەکەت بڵێ باژێر کراسی لەگەڵ لەبەر بکات چونکە دەترسم قەبارەی ئێسکەکانی بەدەر بخات.

بەڵام زۆر بەداخەوە بۆ ئافرەتانی موسلمانی ئەمڕۆ بەپێچەوانەی ئەم فەرموودە شتی والەژێروە لەبەر دەکەن تاقەبارەی لەشیان بەدەرکەوێ.

## مەرجی پێنجەم
## نابێ سەرنج ڕاکێش و شوھرەت دار بێ:

ئەگەر حیجابەکەی لەم جۆرە حیجابانە بوو لەجوانیو شوھرەت ئەوا خوای گەورە پێیان دەفەرموێ: ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾ النور ٣١

**چونکە جلو بەرگی بریقەدارو سەرنج ڕاکێش خۆی بۆ خۆی زینەیە بەر قەدەغەکردن دەکەوێت، شوھرەت جلێکە کەس لەبەری نەکات لەبەر سەرنج ڕاکێشان؟**

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (**من لبس ثوب الشهرة في الدنيا البسه الله ثوب مذلة يوم القيامة ثم الهب فيه نارا**) (**ابو داود فی صحیحه**)واتە: هەر کەسێ جلو بەرگ بۆ ناوبانگی لەبەر بکات خودا لەڕۆژی قیامەت دا جلو بەرگی زەبونی لەبەر دەکاتو ئاگری تێ بەردەدات، کەواتە دوور بکەوە لەجلی بریقەدارو سەرنج ڕاکێشو زەوقی.

## مەرجی شەشەم:
## نابێ خۆی بۆندار بکات:

مەودودی لەکتێبی (الحجاب) دەڵێ بۆنی خۆش نامەیەکە لەنەفسێکی خراپەوە دەچێتە ناو نەفسێکی خراپتر ، هۆکارێکی سەرەکیە بۆ فریودانو لەرێ لادانی کۆمەڵگە ئەگەریش لەکۆڕیك یان مەجلسێك دابنیشێ با خۆشی داپۆشی بێو جوانیو رازاوەیی دەرنەخات بەڵام کە بۆنەکەی لەم شوێنە بڵاوبۆوە سۆزو عاتیفەو ئارەزووی دانیشتوان دەجولێنی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (**أيما امرأة استعطرت ثم خرجت فمرت بالمجلس ليجدوا ريحها فهي زانية، وكل عين زانية**) (**صحيح في الترمذي**) واتە: هەر ئافرەتێك خۆی بۆن خۆش بکاتو پاشان بچێتە دەرەوە بەلای کۆمەڵێك پیاو دا بڕوات بۆ ئەوەی بۆنەکەی سەرنجیان رابکێشێت ئەوا وەك زیناکەر وایە، هەموو چاوێك زینا دەکات.

لەکتێبی (ژنو مێردی ئیسلامی بەختەوەر) دەڵێ: ئایا دەزانن نهێنی شاراوەلەدوای کۆبونەوەی چەند سەگێك لەدەوری دێڵە سەگێك، کە دەیەوێت جووت ببێ چییە؟ ئەم پرسیارکردنە ، کە ماوەی چەند ساڵێکە لەئارادایە، سەرنجی یەکێ لەزانایانی راکێشا، ئەویش ئەو گومانە باوەی هەبوو کە دێڵە سەگ –لەوەرزی زاوزێدا– بۆنێکی مێینە دەردەدات، کەلەشوێنێکی دوورەوە نێرینەکان بۆ خۆی رادەکێشێ هیچ سەگێك ناتوانێت بیر لەجنس بکاتەوە، گەر ئەم بۆنە سیحرییەی بۆ نەیەت جا

ئەو کاتە غەریزەکەی دەبزوێو بەدوای ئەو دێڵە سەگە دەگەڕێ، کە بۆنەکەی دەرکردووە (دوور لەرووی خوشکانی موسلمانان).

یەکێك لەزانایان ئەم راستیە دەگێڕێتەوە، کە سەرقاڵی تاقیکردنەوەی ئەو ماددەیە بووە، کە نێرینەی سەگ هەڵدەنێو جنسی دەبزوێنێ، رۆژێك کارخانەکەی بەجێ دەهێڵێو بەپێ دەچێتەوە بۆ ماڵ، کەمێك لەو ماددەیە بە جلەکانیەوە نوسابوو، جا کۆمەڵە سەگێك بەبێ دەنگی و هاری بەدوای کەوتن، خەڵکیش بەمە سەریان سوڕماو نەیاندەزانی هۆیەکەی چییە.

ئەو بۆنە کاتێك لەدێڵە سەگەوە دەردەچێت، کە ئارەزووی جنسی هەبێت، جا ئەم بۆنە وەك کارتی لێ گێڕانەوەی نهێنی وایە، کە هەوا هەڵی دەگرێ و دەیگوازێتەوە بۆ هەموو سەگەکانی ناوچەکە...هیچ سەگێك ناتوانێت بیر لەجنس بکاتەوە، گەر ئەو نامە کیمیاییەی پێ نەگات!!لوت دەیگوازێتەوە بۆ دەماری بۆن کردنو، لەکۆدەمارەکانیەوە بۆ مێشك و، لەمێشکەوە بۆ لیکە رژێنەکانی جنسی، جا گڕ دەگرێو سەگەکان کۆدەبنەوەو جەنگێکی وردو خاشکەر لەسەر دێلە سەگەکە روودەدات!!ئا بەو شێوەیە لەدواوەی ئەم بیرۆکەیە، کە دێڵە سەگەکە یاری خۆی ئەنجام دەدا.

مەناوی لە(**فیض القدیر**) دا گوتویەتی: بەواتای وەك زیناکەر وایە لەگوناهدا، با جیاوازیشی هەبێ، چونکە بکەری هۆیەکە، وەك

هۆکارەکەیە، (**الطيبي**) گوتویەتی : ئافرەت، کە بە بۆنخۆشی لەماڵەکەی دەردەچێت، ئارەزوی پیاو دەوروژێنێت، وەك زینا کردن وایە.

(كل عين زانیه) بە واتای هەر چاوێك تەماشای ئافرەتێکی بێگانە، یان پیاوێکی بێگانەی کرد، بەشێکی زینای بەرکەوتووە، چونکە ئەمە بەشیەتی لەو زینایە، هەندێك لەمالیکیەکان لەم فەرمودەدا ئەوەیان وەرگرتووە، کە چێژ وەرگرتن بە بۆنکردنی بۆن خۆشی ئافرەتی بێگانە حەرامە چونکە خوای گەورە ئەگەر شتێك حەرام بکات ئەوا شەریعەت ئەو شتەش قەدەغە دەکات کە نزیکە لەو بچێ، ئیبن عومەر رەزای خوای لێ بێ قەدەغەی کردووە، ئەگەر ئافرەتێك لەشوێنێك دانیشت و دوایی هەستا، یەکسەر پیاو لەشوێنەکەی دابنیشێ، مەگەر کاتێ گەرمایی شوێنی دانیشتنەکەی نامێنێ!

# تــــەبــەروج

تەبەروج(التبرج): واتە دەرخستنی جوانیو زینەت و ئاشکراکردنی جوانیەکانی دەمو چاوو جەستەو شوێنی فیتنەی ئافرەتان و رازاندنەوەو دەرخستنیان بۆ بێگانە، هەروەکو لەقورئانی پیرۆزیش هاتووە ﴿ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَـٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ ﴾ .

بۆ پارێزگاری کردنی کۆمەڵگا لەزیانەکانی تەبەروجو پاراستنی جەستەی ئافرەتان لەدەست درێژیو پاراستنی شەرمو شکۆی ئافرەتان لەفەسادو خراپەکاریو دورخستنەوەی دەروونی پیاوان لەهەواو ئارەزووی پیسی شەیتانی ، بۆیە خوای گەورە قەدەغەی کردووە ئافرەتان تەبەروج بکەن چونکە خوای گەورە شارەزاترە بە لاوازی مرۆڤو لادانی گەنجان بەرەو نادروستی جنسی.

تەبەروج تەنها ئەوشتانە ناگرێتەوە کە ئافرەت خۆی پێ دەرازێنێتەوە وەکو خشڵو پۆشاکو بۆیاغ و مکیاج بەڵکو مانایەکی زۆر فروانی هەیە هەروەك لەقورئانو فەرمودە دا هاتیە، بێجگە لەم جۆرە دە جۆری تریشی هەیە:

**یەکــــەم**: تەبــەروج لەســەرپۆش چــەفیە(الخمــار) لەئایــەتی خــودا :

﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ﴾النور: ٣١ واتە: سەرپۆشەکانیان بدەن لەسەر سینگو ملیان زانایـانی تەفـسیر دەفـەرموون ( **علی**

**جيوبهن أي على صدور هنّ: أي يسترنَ الرؤوس والاعناق والصدور والمقانع**)، (**جيوب**) **هاتووە لەجيب** واتە: گیرفانی کراس ، زانایان دەفەرمووێت ئەم ئایەتە هاتە خوارێ بۆ ئافرەتە صحابەکان چونکە لەجاهیلیەت چەفیەیان لەسەر دەکرد بەڵام دەیانخستە پشتەوە، ئایەت هات فەرمووی بخەنە پێشەوە بێتە سەر سینگتان.

پێویستە ئافرەتان خۆیان بێ ئاگا نەکەن لەوەی کە خوای گەورە تەنها فەرمان ناکات بە داپۆشینی سەر بەڵکو فەرمانی کردووە بەداپۆشینی سەرو گەردەن‌و سینگی ئافرەتان، کەواتە دانەپۆشینی گەردەن‌و سینگ تەبەروجە.

**دووەم**: لەم ئایەتەدا هاتووە﴿وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ﴾ نابێ ئافرەتانی ئیماندار قاچیان دەربخەن‌و پێیان بدەن لەزەوی ، کەواتە پێ ی ئافرەت عەورەتەو دەبی داپۆشرێ چونکە خودای گەورە قەدەغەی کردووە ئافرەتانی ئیماندار قاچیان دەربخەن و پێیان بدەن بە زەویدا تا دەنگی خشڵ‌و خرخارەکانیان بێ تا بزانرێت زینەت دار و خشڵ دارن، کە ببێتە هۆی ئاوڕدانەوەی پیاوان لێیان.

**سێ یەم**: لەوانەیە جوانی ئافرەتەکە داپۆشراو بێ ، جلکی فراوانی لەبەر دابێ بەڵام رۆیشتنی بەلەنجەو لارو خۆبادان بێ

بەئەندامەکانی تری تەبەروجی لێ دەردەکەوێ، هەروەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (مائلات مميلات)، مسلم، الترمذي.

واتە: بەلەنجەو لاردەرۆن

**چوارەم:** خوای گەورە دەفەرموێ ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ﴾ النور

واتە: جوانیەکانی خۆیان دەرنەخەن، دیاری نەکردووە جوانی ئافرەت لەچ ئەندامێکی دایە ئەمەش ئەوە دەردەخات کەوا هەموو ئەندامێکی ئافرەتان بە گشتی لەدەرخستنی جوانیدا فیتنەو تەبەروجن، پاشان دەفەرمووێ (**الاماظهر منها**) زانایانی تەفسیر دەفەرموون واتە: دەستو دەمو چاو، هەندێکی تریش دەفەرموون واتە: بۆ مێردو مەحرەمەکانی خۆیان..

**پێنجەم:** تۆپەڵ کردنی پرچ یان بە کارهێنانی قردێلەیەکی گەورە بۆ تۆپەڵ کردن لەناوەراستی سەریان هەروەکو گۆپالەی تۆپی حوشتر تەبەروجە، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (**علی رؤوسهن کأسنمة البخت**) مسلم.

البخت: الابل – واتە: پشتی حوشتر

**شەشەم:** خوای گەورە ﴿فَلَا تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ فَيَطْمَعَ الَّذِي فِي قَلْبِهِ مَرَضٌ﴾ الأحزاب ٣٢ واتە: قسە بەناسکیو بەشێوەیەك مەکەن، نەوەکو ئەوەی دڵی نەخۆشە بورژێتو نیازی خراپ بێت. بۆیە خوای گەورە قەدەغەی کردووە دەنگ باریك کردنەوەو ناسك کردنەوەی چونکە تەبەروج لەدەنگی ئافرەتانیشدا دەکرێ

ئەمەش دەبێتە هۆی راکێشانی سەرنجی پیاوان‌و جولاندنی ئارەزویان بەم قسەو وشانەی کە لەئاستی خۆی زیاتر نا سککراوە، یان بەکارهێنانی وشانیك وەکو گیانە، بەقوربانت بم، خۆشەویستەکەم، دڵەکەم....

**حەوتەم**: هەندێ جار ئافرەت بە تەواوی خۆی دا پۆشیوەو هیچ نیشانەیەکی تەبەروجی لێ بەدەرنەکەوتووە بەڵام خۆی بۆندار کردووە هەروەکو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : (**ایما امرأة استعطرت فمرت علی قوم لیجدوا ریحها فهي زانیة**) رواه الترمذي حدیث صحیح.

واتە: هەر ئافرەتێك خۆی بۆندار کردو بەلای پیاوانێك تێپەڕی تاوەکو بۆنی بکەن ئەوا ئەم ئافرەتە زیناکەرە، کەواتە بۆنخۆش کردنی ئافرەت بۆ دەرەوە دەچێتە ژێر ناوی تەبەروج.

**هەشتەم**: هەندێ جار ئەفرەتان جلکیان لەبەر دایە بەڵام تەسك یان کورت یان تەنکن ئەندامەکانی لەشیان لێ بەدەردەکەوێ هەروەکو لەفەرمودەی پێغەمبەر ﷺ دا هاتووە دەفەرموێ (**نساء کاسیات عاریات**...) رواه مسلم.

**نۆیەم**: دانیشتن بەتەنیا لەگەڵ ئافرەتی بێگانە تەبەروج‌و کارەساتە چونکە یەکسەر شەیتان زینەتی ئەم دووە بۆیە یەکتر دەردەخات‌و چالی فیتنەیان بۆ هەڵدەکەنێ ئەگەر زوو دوور نەکەونەوە لەیەکتری.

قال رسول الله (ﷺ) **ألا لايبيتن رجل عند امرأة ثيب الا ان يكون ناكحاً او ذا محرم (مسلم).**

واتە: باهیچ پیاوێك لەلای ژنێك شوی کردبێ نەمێنێتەوە مەگەر مارە بڕی بێ یان محرەمێکی بێ.

وقال (ﷺ) (**لا يخلو رجل بامرأة الا كان ثالثهما الشيطان**) صحيح الترمذي.

**واتە: هیچ پیاوێك لەگەڵ ئافرەتێك بەتەنیا نامێننەوە ئیلا سێیەمیان شەیتانە.**

**دەیەم:** دروست نییە ئافرەت وەسفی ئافرەتێکی جوان‌وشۆخ‌و شەنگ بۆ پیاوەکەی بکات، چونکە ئەمە دەرخستنی تەبەروجی ئافرەتێکی دیکەیە بۆ پیاوەکەی‌و ئەمە وا دەکات ئارەزووی بورژێنێت‌و تووشی تاوانی بکات.

قال رسول الله (ﷺ): **لا تباشر المرأة المرأة فتنعتها لزوجها كأنه ينظر اليها** (البخاري واحمد)

واتە: بائافرەت وەسفی جوان‌و شۆخ‌و شەنگی ئافرەتێکی دیکە بۆ مێردەکەی نەکات بەوشێوەیەی کەوا لەمێردەکەی بکات سەیری بکات ئەوهاش وەسفی دەکات کە دەیهێنێتە پێش چاوی.

**یازدەم:** ئایەتی ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾

واتە: دەرنەخستنی جوانیەکانی ئافرەت تەنها بۆ مەحرەمەکانی نەبێ (باب‌و براو مام‌و خاڵ‌و کوڕو مێرد) کەواتە تەبەروجە وێنەی ئافرەت لەماڵی بێگانە(نامەحرەم) بیت، هەرچەندە خیلافێکی

توند لەسەر وێنەگرتن هەیە، بەڵام ئەگەر لەسەر ڕای ئەوزانا موتەساهیلانەبێ کە دەڵێن دروستە بەمەرج، بائافرەت وێنەبگرێ بەڵام لەماڵی خۆی بێو جگە لە مەحرەمەکانی نابێ بە هیچ جۆرێك پیاوێکی بێگانە سەیری بکات، جا وێنە لە لەماڵی مام و کوڕە مام سەیری بکات یان وێنە لەماڵی خالوانو کوڕە خاڵ سەیری جوانیو بەژن باڵاو قەبارەی لاشەی بکات، یان ئەم وێنەیە بکەوێتە ماڵی خەڵکی دیکە کە ئەمە هەر کارەساتەو کەشفی عەورەتو تەبەروجە لەمەش سامناکتر بەبیانووی مێرد کردنو بوون بە بووك،وێنەی بوکێنی ببەخشیتەوە بەسەر هەموو خەلکێك جا زاواو پیاوی باوەڕدارو بەشەهامەت چۆن وێنەی شەرمو کەرامەتی خۆی (کەهاوسەرەکەیەتی) بەجلی ڕازاوە بلاو دەکاتەوە تاکو برادەرەبرسیەکانی بەسەیر کردنی وێنە کە چێژی جنس وەربگرنو تینویەتی ئارەزوویان بشکێنن.

**دوازدەم:** لێدانی هەلهەلە لەکاتی گواستنەوەو مارەبرین بەپێی ئایەتی ( ﴿فَلَا تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ فَيَطْمَعَ الَّذِي فِي قَلْبِهِ مَرَضٌ﴾ الأحزاب

ئەم هەلهەلەیە دەنگێکە ئارەزووی پیاوان دەجولێنێت بۆیە زانایان بەنادروستیان زانیوە، هەروەکو (شێخ ابن فوزان) رحمەتی خودای لێ بێ دەفەرمووێ: دروست نییەئافرەت لەئاهەنگدا هەڵهەلە (الزغرطه) لێبدات چونکە ئەم بەرزکردنەوەلەکاتی ئامادەبوونی پیاوان فتنەیە[*].

(*) اكثر من (١٠٠٠) جواب للمرأة - خالد الحسينان

پێویستە خەڵکی بگەڕێنەوە سەر ڕێگای ڕاست و فەرمانەکانی خوای زاناو کاربەجێ ، تێ بگەن کەوا خودا شتێکی قەدەغە نەکردووە مەگەر زیانێکی گەورەی بۆ مرۆڤەکان نەبێت هەروەکو بەدەرخستنی جوانی ئافرەت لەنێوان پیاواندا دەبێتە هۆی لادان و بزواندنی ئارەزوی پیاوان، لەدزی کردندا پیاو دەستپێشخەرە بۆیە قورئان دەفەمووێ: ﴿ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقۡطَعُوٓاْ أَيۡدِيَهُمَا ﴾

بەڵام لەزینا ئافرەت دەست پێشخەرە بۆیە سەرەتا بەو دەست پێ دەکات و دەفەرمووێ ﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجۡلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا مِاْئَةَ جَلۡدَةٖ ﴾ چۆن ئافرەت دەست پێشخەرە، بەم تەبەروجانە خۆی عەرز دەکات و تافیتنەکە هەلبستێ– خودا پەنامان بدات–

(شێخ محمد الغزالی) دەفەرموێ:

ئێمە یەکدەنگین کە سیل نەخۆشیەکەو بڵاودەبێتەوە دەبێتە هۆی نەخۆشی پێست، هەروەکو بەو شێوەیەش تەبەروج دەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی زیناو فاحیشە هەروەکو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : ( **فزنی العین النظر** ) ( **البخاری** )، کەواتە چاوو دڵ زینا دەکەن پێش زینای گەورە.

بێ گومان چێژی بینین تامێکی گەورەی هەیە بۆ مرۆڤەکان، نەتانبینیوە چەندین کەس پارەی زۆر خەرج دەکات بۆ بینینی شتی جوان ماڵەکەی، دیوارەکەی، سەقفەکەی، باخچەی بە دارو گوڵی جوان و

کەل‌و پەلی ناو ماڵ دەڕازێنێتەوە، تەنها بۆ بینین‌و تام لێ کردنی چاوەکانە ئەگەر دەستیشیان لێ نەدات بەڵام چاوەکان ببینن بەسە.

خواردنێکی خۆش دادەنرێت بە بینین دەم لیکاو دەکات و گەدە هۆڕمۆن دەڕژێنێ پێش دەست پێکردنی دەم بە نان خواردن، گوتراوە **(العين تـأكل أكثر من الفم)**.

ئەی دەبێ بینینی ئافرەت‌و دەرخستنی گۆشتەکانی چەند کاریگەری ببێ لەسەر پیاوان؟؟!!

ئافرەتی جوانی دەرخەر تیرە ژەهراویەکانی دەوەشێنێت و تاوانبارە کاتێ بە جوانیەکانی بەندەکانی خودا لەرێگا لادەدات‌و فشاریان پێ دەکاتەوە چونکە بەهەر چوارلا فەساد بڵاودەکاتەوە چونکە ئارەزوو نوستیە ئەگەر بە خەبەری نەهێنی و ئاگادار نیە ئەگەر بانگی نەکەی.

زۆر پیرەژن هەیە (قیناعی ساختەیان پۆشیوە بە مکیاج و دەم‌و چاوکردن‌و...هتد) لەدەرخستن وەك گەنجان هەڵس‌و کەوت دەکات خۆی وەکو ئەو گۆشتە نیشان دەدات بۆ تێوەرهاتنی گورگەکان ئەگەر گۆشتێکی بۆ گەنیش بێ مێش‌و مەگەزی پیسی لەسەر دەنیشێ، وەیل‌و ماڵ کاوڵی بۆ ئەو شەیتانە نەفرەت لێکراوە کە پیاوان دەخاتە ناو ئاگری بە گڕو تین،چونکە چەندین نەزەر بوەتە هۆی سەرگەردانی‌و لێککردنەوەی ژن‌و مێردو دەربەدەری منداڵان، شاعیر دەڵێ:

**نظرة فابتسامة فسلام** **فكلام فموعد فلقاء**

ئەگەر ئەم ئافرەتە خۆی داپۆشت و بالاپۆش بوو وازی لە لەنجەو لاریو قسەی وروژێنەر هێنا بۆ بلاونەبوونەوەی فەسادو شەڕ بێگومان ڕێزو شەرەفو پایەکەی بە پەرژینی پۆلاینن پارێزراو دەبێ.

## تەبەروج سوکایەتیە بۆ ئافرەتان

هەر ئافرەتێك لەپەردەی شەرم دەرچوو بەرەو شەقامەکانوخۆی رازاندەوەو خۆی دەرخست، خۆی لەخۆیدا قسە دەکاتو دەڵێ ئایا سەیری ئەم جوانیەم ناکەن؟ئایا کەس حەزناکات لێم نزیك ببێتەوەو پەیوەندی ببەستێ؟

چونکە جوانیەکانی دەرخستووە لەبازاڕو شەقامەکان هەروەکو بازرگانەکان کەلو پەلەکانیان عەرز دەکەن بە رەنگی و رەنگاورەنگو شێوەی جوان تاکو سەرنجی کڕیارەکان رابکێشنو کاربکەنە سەر دەرونیان چێژیان بۆ بکەنەوە ئەم عەرزکردنە باشترین ڕێگایە بۆ چاوبرسیو دەروون تێنوەکان.

چۆن ئافرەتی بەشەرمو بەشەرەف جوانیەکانی خۆی دەردەخات لەبازاڕەکان بە نرخێکی کەمو سوك چاوە پیسەکان خۆیان پێ تێر بکەن. ئایا ئەم ئافرەتە پاکە رازیە پەیامێك بۆ جولاندنی ئارەزووی پیاوان و بیرکردنەوەی پیاوان بە خراپەو سێکس لەسەر خۆیی؟؟!!

بەراستی ئافرەت بیر لەم بارە بکاتەوە شەرم سوری دەکاتەوەو

عارەقەی لێ دەتکێ بۆیە جوانیەکانی خۆیان دادەپۆشن و دەری ناخەن بۆ چاوە ترسناکەکان.

قورئان زۆر بە ئاشکرا ئەم راستیەی دەرخستووە و دەفەرموێ:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَـٰبِيبِهِنَّ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٥٩﴾ ﴾ الأحزاب: ٥٩

لەم ئایەتەدا خودا پەرژینێکی رێزو پاکی لەدەوری ئافرەتانی ئیماندار چاندووە تاوەکو لەبەرزیەتیو گەورەیی دانەبەزن، خۆشەویستمان ﷺ فەرمان دەکات بە خێزانەکانیو هی ئیماندارانیش کە پابەند بن بە (جلباب)، جلباب بەرگێکی فراوانو ئەستورە هەموو لاشە دادەپۆشێ تاکو بەم بەرگە بناسرێتەوە کە ئەمە ئافرەتێکی بەشەرمو شکۆو خواناسە، کردەوەی خراپەکاران ئەزیەتی نادەن، سوکایەتی پێ ناکەن، نە بە چاوەکانیان نە بە وشەی سوك، بەمە دەناسرێنەوە کە ئەهلی قورئانن چونکە فەرمانەکانی قورئان جێ بەجێ دەکەنو ئینجا ئیمانداران رێزی لێ دەگرنو فاسیقەکانیش ئەزیەتی نادەن.

سینگی رووت بکاتو بەلەنجەو لار بڕوات و دەمو چاوو لێوی یەك پارچە بۆیە بکات پرچەکانی تەل تەل شۆڕبێتەوە، هیچی لەتەبەروج جێ نەهێلابێ ئاخەر دڵم پاکە، ئاخەر چۆن ئافرەتێکی سەماکەری رووتی خراپەکار جیادەکرێتەوە لەئافرەتێکی پاکی ئیمانداری داپۆشراو.

راستە گورگەکان بەدوای ئافرەتانی پاکیش دەکەون بەڵام کاتێك ئەم گۆشتە ئامادەکراوە بەدەرخەرە ببینن گورگەکان تا لێی تێر نەخۆن واز ناهێنن چونکە هەرزان فرۆشی کردووەو نرخی نەماوە.

ئەگەر بە چاوی دڵ سەیر بکەن‌و رابمێنن لەم جوانیە دەستکردەی ئافرەت کە بۆخۆی دروستی دەکات با بزانیّ خوای گەورە جوانترینی جوانیەکانی بۆ ئافرەت بڕیار داوە ئەم جۆرە دەستکاریە لەسروشتی مرۆڤ ناچیّ چونکە خوای گەورە چاوی شینی بریقەدار یان رەش تەنها بۆ مەیمون‌و سەگ دروست کردووە، ئەم لێو سورکردنە بەوەدەچیّ بەدەمی لەخوێنی سوری خواردبیّ ئەم برۆ باریکی یە تەنها لەبرۆی شەیتان هەیە هەروەکو لەچیرۆکەکان هاتووە. ئەم نینۆك درێژیە بەس لەنینۆکی درندەکان دەچیّ ئینجا بۆیە سورەکەی کە دایبپۆشیە وەکو لەسەر لاشەی نێچیرو لاشە بۆگەنەکانی خواردبیّ و بەچڕنوکی چڕاندبیەوەو بە خوێن بووبیّ. توخوا ئەمە جوانیە یان ناشیرینی‌و فێڵبازی،ئەم تەشویە کردنە لەکویّ؟ خەلقە جوانەکەی خودا –احسن التقویم– لەکویّ، لەدوارۆژیشدا پێچەوانە دەبێتەوە جگە لەنەخۆشیەکانی پێست جوانیە ئاساییەکانیشیان نامینێت وای لیّ دیّ بەبیّ ئەم مکیاجە ناتوانن بچنە شەقامەکان ئینجا ئەم جلە تەسکانە زیانی زۆر بەلاشە دەگەیەنیّ بەتایبەت منداڵدان‌و نەزۆکی هەروەکو لەئامارێکی تەندروستی جیهانی هاتووە زۆربەی نەزۆکەکان سفورو جل تەسك بوینە.

## بەهانە بێ بنەماکان

چۆن بێ بڕواو جاهیلەکان مل کەچی هەواو ئارەزووی خۆیان بوینە هەندێ موسڵمانی نەزانیش کەوتۆتە ژێر کاریگەی هەواو ئارەزوو شەیتان، نەفسی خۆی بۆ تەبەروج بەهۆی هەندێ بەهانەی بێ بنەماوە وەکو:

١-هەندێ کەس دەڵێن ئەوە گوناهە بچوکەکانە.

٢-هەندێکی دیکە دەڵێن ئەوە نیشانەی پێش کەوتن‌و مەدەنیەتە.

٣-هەندێکی تر دەڵێن ئەگەر خۆمان نەڕازێنینەوەو تەبەروج نەکەین خەڵکی تر گاڵتەمان پێ دەکەن.

٤-هەندێکی تر دەڵێن تۆمەتبارمان دەکەن بە کۆنەپەرستی‌و ئیسلامی.

٥-هەندێکیتر دەڵێن ئەمە ڕێگایەکی بەپەلەیە بۆبەشودانی کچەکانمان زۆر داواکاریان دێت.

٦-هەندێکی تر دەڵێن سەرنجی مێردەکانمان پێ رادەکێشین تاوەکو مەیلیان نەڕوات بۆ ئافرەتی تری رازاوەو خۆ دەرخەر.

٧-هەندێکی تر دەڵێن منداڵەو تەمەنی بچوکەو جارێ زووە بۆ باڵاپۆشی.

٨-هەندێکی تر دەڵێن ئاخەر پیربومەو کەس تەماشام ناکات.

٩-هەندێکی تر دەڵێن ئاخەر ناشیرینین‌و پیاوان لەدەستمان رادەکەن وە سەیرمان ناکەن.

١٠-هەندێکی تر دەڵێن خودا هێشتا هیدایەتی نەداوم.

## تەبەروج بەڵگەیە لەسەر نەزانی ئافرەت

قورئان دەفەرموێ﴿وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَـٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ ﴾الأحزاب. واتە. نەکەن جوانیەکانی خۆتان دەرخەن بۆ دەرەوەو بێگانە هەروەکو سەردەمی جاهیلیەتی. ئومەیمەی کچی رەقیقە چووە لای پێغەمبەر ﷺ کە لەسەر ئیسلام پەیمانی بداتێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (...**ولا تتبرجي تبرج الجاهلية الأولى**) واتە: پەیمانت لێ وەردەگرم جوانیو رازاوەیی خۆت وەکو ئافرەتانی سەردەمی نەفامی بۆ پیاوانی بێگانە دەرنەخەیت.هەروەها عەرەب دەڵێ : (**الرأس الفارغة تحتاج الى زين، وأما الرأس المملوءة بالعلم فإنها لا تحتاج ألى زين**) واتە: مێشکی بەتاڵ پێویستی بە خۆرازاندنەوە هەیە، بەڵام مێشکی پڕ زانست پێویستی بە رازاندنەوەو دەرخستن نیە، چونکە زانست جوانی کردووە کە لەراستیدا ئافرەتی خاوەن زانست و شەهادەو پلەبەرزەکانو خاوەن هونەرەکان لەجلو بەرگدا زۆر سادەن، زۆر گرنگی بە لاشەو دیوی دەرەوە نادەن بەڵکو گرنگی بە ژیریو عەقلو مەعریفەت دەدەن کەسێ گرنگی بە ناوەڕۆك بداتو دەرەوەی لا بچوك دەبێت بەڵام کەسێك هێزی خۆی بە دەرەوە داو تەبەروجی کرد ناوەڕۆكو عەقلی لەبیر دەچێو بچوك دەبێتەوە بەڵکو ئەمە تەنها لەمنداڵ دەوەشێوەتەوە کە جلکی جوانو نوێو بە باقو بریق لەبەر بکاتو خۆی بە خەڵك نیشان بدات و خۆی پێ با بدات، بەڵێ تەبەروج بۆ منداڵە؟؟!!

وەیل بۆ ئەوەی پەروەردەی دەستی جاهیلیەتو نەفامیە کە ناتوانێ سەرپێچی ئارەزووەکانی خۆی بکات و بە ئاسانیش سەرپێچی خالقی دەکات چەندین جار گوێی لێ بووە لەئایەتەکانی خودا کە جەخت دەکاتەوە لەسەر داپۆشینی بەرگی شەرمو شکۆ بەلاّم ئەو بە موتەکەبیریەوە بەردەوامە لەسەر تەبەروج و بەرەلاّیی وەکو ئەوەی کە هەر گوێ لەقورئان نەبووبێ :

﴿ وَيْلٌ لِّكُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ ﴿٧﴾ يَسْمَعُ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ثُمَّ يُصِرُّ مُسْتَكْبِرًا كَأَن لَّمْ يَسْمَعْهَا ۖ فَبَشِّرْهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٨﴾ وَإِذَا عَلِمَ مِنْ ءَايَٰتِنَا شَيْـًٔا ٱتَّخَذَهَا هُزُوًا ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٩﴾ ﴾ الجاثية: ٧

یان وا گومان دەبات ئەو بێ ئاگاو نەفامە کە خودا شەریعەتی بۆ ناردووە بە ئارەزووی خۆی تێیدا هەڵبژێرێ کامەی پێی خۆش بووە بیکاتو کامیشی نەویست سەرپێچی بکات واتە لەهەندێ شت بە قسەی بکات وەکو نوێژو رۆژی و عومرە... وە لەهەندێ شتیش سەرپێچی بکات وەکو حیجابو چەفیەو دوورکەوتنەوە لەتەبەروج مەگەر گوێی لەهەرەشەی قورئان نەبووە کە دەفەرموێ :

﴿ أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ ٱلْكِتَٰبِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ ۚ فَمَا جَزَآءُ مَن يَفْعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمْ إِلَّا خِزْىٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰٓ أَشَدِّ ٱلْعَذَابِ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٨٥﴾ ﴾ البقرة

قەت خوای گەورە شەریعەتی نەناردۆتە خوار کە بەدوای هەواو ئارەزووی خەلك بکەوێ ، بەپێی میزاجی خەلك لێی هەلبژێرێ :

﴿ وَلَوِ ٱتَّبَعَ ٱلْحَقُّ أَهْوَآءَهُمْ لَفَسَدَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ ۚ بَلْ أَتَيْنَٰهُم بِذِكْرِهِمْ فَهُمْ عَن ذِكْرِهِم مُّعْرِضُونَ ﴿٧١﴾ ﴾ ٧١

﴿ وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾ ﴾ ٣٦

---

(١) سودم بینیوه له( التبرج )ی نعمت صدقی

# شێوازی عەلمانیەکان بۆ بەرۆژئاوایی (تەغریب) کردنی ئافرەتی موسڵمان

خـوای گـەورە لەقورئانــدا رێنمـویی کـردوین تــاکو رێگــای تاوانبــاران بناســینەوەو خۆمــانی لــێ دووربگــرین ﴿وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْـَٔايَٰتِ وَلِتَسْتَبِينَ سَبِيلُ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٥٥﴾﴾ هــــەروەها فرمــــانی بــــە پێغەمبەرەکەی ﷺ کردووە جیهاد بکات بەرامبەر کافرو دوورووەکان ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ ﴿٧٣﴾﴾ بێ گومان جیهـاد بەرامبـەر کـافران بـە بەڵگـەو چـەك دەبێـت، جیهـادی مونافیقانیش بە بەڵگەو روون کردنەوە دەبێت چونکە منافق حوکمی موسـڵمانی هەیـە خـۆی لـەناو ئیـسلام حەشـارداوەو بیروبـاوەڕی دەرناخات، خـودای گـەورە ئـابڕووی مونافیقـانی بـردووە لەقورئانـدا لەسورەتی( النساء – التوبه – الاحزاب – البقره).

ئەمانــە تــاقمێکن ئابڕویــان نــەماوە ، ئەوانــەی دەیــشارنەوە خــودا بەدەریدێخێ تاکو خەڵك بیزانن و پێی هەڵنەخەڵەتێن.

بۆیـە پێویـستە شـارەزابین لەبـەرۆژئاواکردنی ئـەم ئوممەتـە بەتایبـەت ئافرەتان لەلایەن عەلمانیەکانەوە، تاکو ئەم شەرو دەردو کارەساتە

دورخەینــەوە لەموسـڵمانان، چـونکە عەلمانیـەکان مەترسـی هــەرە گـەورەن بـۆ سـەر ئومـەتی (محمـد) صـلی الله علیـە وسـلم، بەسـەر مێـشکی هــەمومان دادێـت بۆچـی ڕۆژئـاواو عەلمانیـەکان ئەوەنـدە جەخت لەسەر ئافرەت دەکەنەوە.

نهێنی ئەوە لەوەدایە ئـەوان گرنگـی و ڕۆڵـی ئـافرەت دەزانـن لەدروسـت کردنــی ئومەتـــەو کاریگـــەری لەســـەر کۆمـــەڵگا، بۆیـــە چ کـــات سەرکەوتوبون لـەگومڕاکردنی ئـافرەت ئـەو کاتـە شـورەکانو قـەڵای موسڵمانان ئاسان دەبێت تێکی بدەن بە بێ بەرگری.

هەندێ لەوان گوتویانە: بەرداخێکی عـەرەقو ئـافرەتێکی داوێـن پـیس و بەڕەڵا کاریگەری زیاترە لەسەر ئومەتی ئیسلام لەهەزار تۆپ.

**بەرۆژئاوا کردن:** ئەمـە لەلایـەن سیاسـەتمەدارانی ڕۆژئـاوا دروسـت بـوو پـــاش ســـەرنەکەوتنیان لەهەڵمەتـــە ســـەربازیەکان بەمـــەش بـــیری بەرۆژئاواکردن هاتە دیو بنەمای ئەم بیرەش پێك دێت لەسەر :

توانــەوەی کەسـایەتی موسـڵمان لەکەسـایەتی ڕۆژئـاوا، تـەنها بەچـاوی ڕۆژئاوا سەیر بکاتو سەرسام بێت بەوەی ڕۆژئـاوا پێـی سەرسـامە و لەگەڵ دوورکەوتنەوە لەبیروباوەڕو ڕەوشتی ئایینی ئیسلام.

سەرەتای بەرۆژئاواکردن لەسەدەی نۆزدەهەم لەمیسر دەستی پێ کـردو وڵاتانی تریشی بە دواداهات، (محمد علی پاشا) پاشای میسر (رفاعـە الطهطاوي ) نارد کە دەرچووی ئەزهەر بوو بـۆ فەرەنـسا تـاکو پـێش

نوێژی بکات بۆ نێردەی میسر لەوێ بەڵام زۆری پێ نەچوو ئەم پیاوە تواوە ئەو بیرە پیسەی لەگەڵ خۆی هێناوە و ئیتر بانگەوازی بۆ بەرۆژئاوابوون کردو ئاڵای بەناو ئازادکردنی ئافرەتی هەڵگرتو کتێبێکی لەسەر فەرەنسا دانا.

پاش ئەمە لەمیسر (قاسم ئەمین) بۆ تەواو کردنی خوێندنی گەشتی فەرەنسای کردو ئەویش کاریگەرو سەرسام بوو بە فەرەنسا، قاسم ئەمین کتێبێکیشی دانا بە ناوی (ئازادکردنی ئافرەت) لەساڵی ١٨٩٩ کە تێیدا هێرشی کردبوە سەر سەر پۆش‌و بانگی بۆ سفور دەکرد پاشان گۆڤاری (السفور) دەرچوو کە تا ئەو کاتەشی ئافرەتان سەرپۆش‌و بەڵکو دەم‌و چاویشیان دادەپۆشی‌و تێکەڵی پیاوان نەدەبون.

پیلان دانرا بۆ سەرخستنی ئەم فیکرە بۆگەنەیان لەلایەن سەرکردەی بەناو نیشتیمانی (سعد زغلول) کە پیاوی ئینگلیز بوو لەگەڵ هاوسەرەکەی (صەفیە زغلول) گەڕانەوە میسر و خەڵکی لەپێش وازی دابوون و چووە ناو ئافرەتان و (هدی شعراوی) پێشوازی لێکرد و ئەویش سەرپۆش‌و حیجابی لەدەم‌و چاوی فڕێداو تێکڕا دەستیان کرد بە چەپڵە لێدان.

(هدی شعراوی‌و صەفیە زغلول) سەرکردایەتی ئەو خۆپیشاندانە ئافرەتانەیان کرد لەساڵی ١٩١٩ کە گەیشتنە گۆڕەپانی (إسماعیلیە)

لەقاهیرە هەڵسان بە سوتاندنی حیجابو دوای ئەمە ئەم گۆڕەپانە ناونرا بە گۆڕەپانی (تەحریر).

*پاشان (هدی شعراوی) و ئافرەتانی تریش سەرکەوتوبوون لەگرێدانی کۆنگرەیەکی ئافرەتانی عەرەبی کە چەندین بڕیارو داواکاریان دەکرد لەوانە:

–سنورداركردنی (طلاق)و فرەژنیو دەسەلاتی وەلی ئەمر.

–یەکسان کردنی تەواو لەنێوان ئافرەتو پیاو.

–داواکردن بۆ لابردنی (نون النسوة).

–داواکردن بۆ کۆکردنەوەی هەردوو رەگەز لەخوێندنی سەرەتایی.

رۆژئاواو ئینگلیزیش دەست خۆشیان کرد لەم کۆنگرەیە.

## دیمەنەکانی بەرۆژئاواکردنی ئافرەتی موسڵمان

١–تێکەڵاوی لەگەڵ پیاوان لەخوێندنو کارکردندا، چونکە هەر کاتێك پیاوو ژن گەیشتنە یەك دەبێتە هۆی جولاندنی شەهوەتو ئارەزوەکان.

٢–تەبەروجو سفور: تەبەروج واتە بەدەرخستنی جوانیەکانی ئافرەت بۆ ئەو کەسەی کە بۆی حەلال نیە.

سفور: بەدەرخستنی هەندێك لەلاشەی کە حەرامە بۆ غەیری مەحرەمەکانی وەکو لاقو باسك.

٣–بەدواداچونی ئافرەتانی موسڵمان بۆ مۆدیلو جلی ئافرەتانی رۆژئاوا.

٤-خـەلوەت کردنـی پیـاو لەگـەڵ ئـەو ئافرەتـەی کـە مـەحرەمی نیـە، بێگومان ئەمەش کاری کافرانە چونکە هیچ ئـاین‌و دینێکیـان نیـە تـا ئەم شتەیان لەسەر حەرام بکـات، بۆیـە لای هەنـدێ کـەس ئاسـاییە خەلوەت و بەتەنها مانەوە لەدائیرەو دوکان‌و تەکسی‌و...

## یاسایەکی گرنگ

هەموو باتڵێك لەسەر رووی زەوی دەبێ بـە پۆشـاکی چـاك سـازی دا بپۆشرێت تاکو خەڵکی قبوڵی بکەن، باتـڵ خـۆی ناشـرین‌و پیسە ئەگـەر لەسەر شێوە راسـتەقینەکەی خـۆی دەرکـەوێ دەرونـەکان وەری نـاگرن هەر بۆیە عەلمانیەکان‌و رۆژئاواییەکان هەڵدەستن بە جوان کردنی رێبـازو ئامـانج‌و بیرەکانیـان، دەڵـێن کـارکردنی تێکـەڵاو بەرژەوەنـدی میللـەتی تێدایە و تا نیوەکەی تری کۆمەڵگا کاربکات‌و قازانجی ئـابوری زۆر بێـت، لەژێر ناوی ئافرەت مافی خۆیەتی بە ئازادانە بێتـە دەرەوەو بـچێتە هـەمو شوێنێك.

پاش ئەمەش عەلمانیەکان سەیری هەندێك عادەتی ناو موسڵمانانیان کـرد کـە لەئیـسلام دانیـە، ئـەم عادەتانـەیان قۆسـتەوە و تـاکو لـەوێ ژەهرەکانیان برێژن‌و پیلانـەکانیان جـێ بـەجێ بکـەن ئەمانـەیان هـەموو خستە سەر ئیسلام.

نموونە: لەهەندێ کۆمەڵگای موسڵمانەکان ستـەم لـەئافرەت دەکـرێ لەمیرات یان بێ بەش دەکرێت، دەبینی پیاوێك دادگـەری ناکـات لـەنێوان

خێزانەکانی پێچەوانەی فەرمانی خـوا دەکـات لـەم کەلێنـە عەلمانیـەکان زیاتر هاتنە ژووریێو ژەهری خۆیان رشت، لەگـەڵ ئـەوەی ئـەم شـتانەش لەئیسلام دا نی یە بەڵکو لەدیدی ئیسلامدا ئەمانە ستەمن و خاوەنەکـەی لەرۆژی قیامەت سزا دەدرێت ئەگەر هاتو تەوبە نەکات.

## شێوازی عەلمانیەکان بۆ بەرۆژئاواکردنی ئافرەتی موسڵمان:

١-دەزگای راگەیاندن بەهەمو جۆرەکانی: لەرۆژنامەو ئێزگەو تەلەفزیۆن‌و فلیم‌و گۆڤاری تایبەت بە مۆدێل‌و گۆڤاری ئافرەتـان، چـونکە ئەمانـە رای گـشتی دەبـات بـەو ئاراسـتەی کـە دەیـەوێت بـە تایبـەت ئـەو عەقلانەی کە بەتاڵن وپاك نەکراون بە قورئـانی خـودا.راگەیاندنـەکان کە چەندین ناپەسەندو ناشرینی تێدا دەبینـرێ لەهـەموو گۆڤارەکـان لەسەر بەرگ وێنەی ئافرەتێك هەر دادەنێ، هەر هەفتەیەك وێنەیەکی تـازە کـە بەچـەندین رەنـگ بۆیـاغ کـراوەو جـارێکی تـر وێنـەی ئـەم ئافرەتانە لێنادرێتەوە، بە کەم زانینی ئەم ئافرەتانە و گەڕانەوەی بۆ سەردەمی کۆیلە کردنی ئافرەتان رەفتارکردن لەگەڵ ئافرەت تـەنها وەك جەستەیەکە کە روحـی تێـدا نـەبێت بەرانبـەر چـەند پارەیـەکی کەم.

ئەم ئافرەتەی کە لەگۆڤارەکەدایە و چەند پرسیارێکی بێ مانـای لـێ کراوە وەکو: ئایا رۆژێك لەرۆژان خۆشەویستیت کردووە؟ ئایـا ئـارەزووی

تۆ چی یە؟ ئایا هاوڕێیەتیت لەگەڵ پیاوێك كردووە؟ تەنها مەبەست لەپشتی ئەم قسانە فەسادكردنی ئافرەتانە.

هەروەها لەم گۆڤارانەدا چەندەها وێنەی بێ ئابروو وێنەی رووت دەبینرێ بە هەنجەتی گوایە جوانی نیشاندانە، یا خود قەدباریكی یا بە هانەی وەرزشی یا كێش دابەزاندن یا شاجوانی.

ئینجا لەناو ئەم گۆڤارانە دا باسی چەندەها بابەتی بە ناو خۆشەویستیو عاشقاتی كە مەبەست لەپشتی بە كەم زانینی تاوانەكانەو گۆڕینی رەوشتە رەسەنەكانو دانانی رەوشتی رۆژئاوایە لەجێگایدا .

شێخ (العثيمين) رەحمەتی خوای لێ بێ لەسەر باسی ئەم گۆڤارانەدا دەڵێت: هەڵگرتنی ئەم گۆڤارانە حەرامە هەروەها كڕینو فرۆشتنیو قازانجەكەی حەرامەو بەدیاری بەخشینی حەرامە وەرگرتنی وەكو هەدیە حەرامەو هەر شتێك ببێتە یارمەتی دان بۆ بلاوبونەوەی حەرامە چونكە یارمەتی دانە لەسەر خراپە.

دەربارەی تەلەفزیۆنیش لەراپۆرتێكی یونسكۆ دەركەوتووە لەیەكێك لەتوێژینەوەكان لەسەر (٥٠٠) فیلم، سەرەنجام لەبابەتی (خیانەی زەوجیو تاوانو سێكس خۆكوشتن بە رێژەی (٧٢٪) رەوشتی بینەرەكانی بەرزكردۆتەوە.

٢-لەئامرازە مەترسیەكانی عەلمانیەكان بۆ بەرۆژئاواییكردنی ئافرەتی موسڵمان ئەویش خۆخزاندنە ناو لایەنی پەروەردەییەوە، یاخود داڕشتنی پرۆگرامی خوێندن كە زۆر دوورە لەخوێندنی ئافرەتی

موسڵمان، لەناو پرۆگرامەکاندا بانگەوازیکردن بۆ یەکسانی لەنێوان ژن‌و پیاودا لەهەموو شتێك، هاندانی ئافرەت بۆ بەناو ئازادی ئینجا تێکەڵاو کردن لەقۆناغەکانی خوێندن لەسەرەتایی تا کۆتا دەرچوون کە ئەمەش بەتەواوی رێگابەردانە لەبەر دەم هەر فەسادێك کە بۆ ئافرەت بێت.

٣-رێگایەکی تر دانانی کتێب‌و نامیلکە دەربارەی ئافرەتان بەناوی ئامۆژگاری‌و پێشنیارو چارەسەر بۆ کێشەکانی ئافرەتان هەندێك لەو بابەتانە وەکو زاڵ بوونی پیاو لەسەر ئافرەت یان سەرپۆشی ئافرەت بەشێوەیەك نوسراوە کە لەدژی بەرژوەندی ئافرەت بێت، داوا دەکرێت خوێندن هەردەم تێکەڵاو بێت تاکو قوتابیەکان سەرکەوتوو بن بە سەر ئەو بەربەستەدەرونیانەی نێوان هەردوو رەگەز.

٤-هەستان بەبەستنی کۆنگرە لەسەر کێشەکانی ئافرەتان ئینجا چاوپێکەوتن لەسەر بابەتی فێرکردن‌و پەروەردەو گۆرینی ، چەندەها بابەتی تر باس دەکرێت وەکو پێداچوونەوە بەیاساکانی باری شارستانی‌و یاسا عەلمانیەکان لەبابەت هاوسەرگیری و تەڵاق دان بۆ مەبەستی بەرۆژئاواکردنی ئافرەتی موسڵمان.

٥-ستەم کاری لەبەکارهێنانی پۆست‌و پلەو پایە، کەسێك لەپۆستێك دایە هەڵدەستێ بە دەرکردنی یاساو بریار کە سەرپۆش قەدەغە دەکات یا تێکەڵاوی بەسەر خەڵك دەچەسپێنێ یا قەدەغەکردنی چالاکی ئیسلامی و چەندین کاری تر...

٧-بانگەوازی کردن بە شوێن کەوتنی مۆدیلو خنکاندنی وڵاتانی ئیسلامی بە پۆشاکی ئابڕوبەر کە ئەمەش زۆر مەترسی دارە چونکە پۆشاك دروشمی گەلانە و هەموو نەتەوەیەك پۆشاکی تایبەتی خۆی هەیە راستە ئیسلام پۆشاکێکی تایبەتی بۆ پیاوو ئافرەت دیاری نەکردووە بەڵام مەرجی داناوە بۆ پۆشاکی هەردوکیان ئەگەر ئەم مەرجە شەرعیانە هاتنە دی ئەوا ئەم پۆشاکە رێگە پێدراوە، ئافرەتانی موسڵمان داوایان لێکراوە کە دوورکەونەوە لەشوێن کەوتنی رۆژئاوا لەمۆدیلو پۆشاکەکانیان، بەداخەوە یەکێك لەئێمە ناتوانێت مەگەر بە ماندوبونێکی زۆر نەبێت پۆشاکێکی بەرین و درێژ بۆ منداڵەکەی بدۆزێتەوە.

٨-لەشێوازەکانیان دروست کردنی رێك خستنو کۆمەڵەو یەکێتی ئافرەتانە ئەویش بە پاڵپشتی رۆژئاوا، ئەم کۆمەڵانە رووی دەرەوە دەردەخەن هۆشیاری رۆشەنبیریو چاکسازیو فێرکردنی ئافرەتان بۆ هەندێ پیشە وەکو دورمان و لێدانی ئامێری مۆسیقا بەڵام لەناوەڕۆکدا ژەهرێکی پیسی پێ یەو ئافرەتان فێری بیروبۆچونی رۆژئاوا دەکات و دەیگوازێتەوە لەرۆشنایی ئیسلام بۆ تاریکی رۆژئاوا ، لەگەڵ ئەوەش ئینکاری ئەوە ناکرێت کە هەندێك کۆمەڵە هەنە بە راستگۆییو بۆ بەرژەوەندی ئافرەتان لەژێر رۆشنایی ئیسلام کاردەکەن.

٩-شێوازێکی تریش بە گەورە راگرتنی بەدرەوشتە رۆژئاواییەکانو ئەکتەرەکانو سەماکەرەکان و گۆرانی بێژەکان، جگە لەوەش دەڵێن فلان ئەستێرە یاخود فلان ناودار یان فلان پێشەنگە، چونکە ژمارەی پێوانەیی شکاندوە لەفلان یاری دا یا لەفلان رێگادا، والەئافرەتی موسڵمان دەکەن گومان ببات کە ئەمە راستەو دەبێت بە دوای بکەوێت ئەویش وای لێ دێت تەمەناو هیوا دەخوازێت کەوەکو ئەو بێت یا خۆی بەوی دەچوێنێت.

١٠-لەپیس ترین شێوازەکانیان ، پەل کێش کردنی کچان بە تایبەتی کچانی زیرەكو لێهاتوو بۆ نواندنو کارکردن لەئێزگەو تەلەفزیۆنەکان بە تایبەت ئەگەر هاتو ئەو کچانە حەزیان لەناوبانگ بێت.

١١-لەشێوازەکانیان پەروەردەکردنی کچانی بچوك لەسەر سەماکردنو مۆسیقاو گۆرانی گوتن لەرێی قوتابخانەکانو ناوەندەکانو پاشان بەدەرخستنیان لەدەزگا راگەیاندنەکان، دەبینرێ منداڵان لەتەمەنی گوڵدان دەردەچن بۆ سەماکردنو گۆرانی گوتن خۆیان دەجولێنن و جوانترین و روتترین جلکیان لەبەردا کردوون دەبێ حالی ئەم کچانە چۆن بێت کاتێ گەورە دەبن دەڵێن گوایە دەبنە گۆرانی بێژ یا ئەکتەرێکی باش یا ئەستێرەیەك لەداهاتودا.

١٢-رێگایەکی تری ترسناك بە ناوی گیانی وەرزشیو چارەسەری سروشتی چەندین یانەو ناوەندیان کردۆتەوە بۆ ئافرەتان ناشزانن چەندین نەخۆشی بەدوای خۆیدا دەهێنێ کە تێیدا یاری دەکەن

بەرانبەر پارەیەکی دیاری کراو، بە مەهانەی دیتنەوەی رێگایەکی نوێ تاکو ئافرەتان کاتەکانیان بەسەر ببەن و پارێزگاری لەجەستەی خۆیان بکەن کە ئەمەش ئافرەتان دووردەخاتەوە لەشتە گرنگەکان (دایکایەتی و ناو ماڵ) ئینجا دورخستنەوەیان لەئاینەکەیان پاشان چەندین شتی ناشەرعی لەم ناوەندەدا دەکرێت لەمانە:

أ-بڵاوبونەوەی جلو بەرگی ناشەرعی چونکە مەرجن ئەم جلکانە لەو شوێنانە.

ب-هەستانی هەندێك ناوەند بە دامەزراندنی پزیشکی پیاو کە دەبێت ئەوانەی راهێنان دەکەن بچنە لای ئەو پزیشکانە.

ج-بڵاوبونەوەی مۆسیقای رۆژئاوایی لەکاتی یاریەکاندا .

د-دانانی حەمامو ساونای بەکۆمەڵ تێیاندا کە ئافرەت بە جلکی ژێرەوە کۆدەبنەوە.

١٤- بڵاوکردنەوەی باخچەو چێشتخانەی تێکەڵە، کە چەندەها زیانی بەدوای خۆیدا دەهێنێ لەوانە گەنجی کورو کچ لەوێ بەیەك دەگەن‌و ئافرەت بەبێ مەحرەم دەچێتە ژورێ کە دەبێتە جێگایەك بۆ دیدارە پیسەکان و چەندین شتی تر ، لەوانەیە ئەم شوێنانە بە نیەتێکی باشیش دامەزرا بن بەلاّم هۆکارە بۆ بەرۆژئاوا کردنی ئافرەتان چونکە لەبەر روودانی تێکەلاّوی و خەلّوەت لەنێوان نێرو مێدا(*) .

(*) پوختم کردووەتەوە لە نامیلکەی (أساليب العلمانيين ف تغريب المرأه المسلمه - الشيخ بشر بن البشر)

١٥- كۆتایی ئەم شێوازانەش لاسایی كردنەوەی رۆژئاواییەكانە لەكاتی مارەبڕین، پاش تێكەڵ كردنی ژن و پیاو ئینجا ئەنجامدانی هەندێ كاری منالآنەو ئارەزوو بزوێن وەكو كیك و شەربەت بەدەم یەكتروەكردنی بوك و زاوا راستی ئێمە هەرزانیومانە خواردن بەدەم منالٚ وەكرێ پاشان لەبەر چاوی كوڕان و كچانی لاوو نامەحرەم كەئەمە دەبێتە هۆی و وروژاندنی ئارەزووە جنسیەكان لەومەراسیم و ئاهەنگەدا ئەوا چوونەسەر دینی ئەوان واتە گاورو جوولەكان هەروەكو پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: من تشبه بقوم فهو منهم . واتە هەر كەسێك خۆی بەگەلێكی تر بچوێنێ ئەوا لەوانە.

## لەکۆتاییدا

ئافرەتانی قەدرگران‌و لێرەوە زیاتر هەوڵبدە خۆت لەقورئانی پیرۆزو فەرموودە شیرینەکانی پێغەمبەر (ﷺ) شارەزابکەو خۆت فێری بیرو باوەڕو خوو رەوشتی ئافرەتە سەحابیەکان بکەو دەست بگرە بەشەریعەتە پاکەکەی ئیسلام ئەو کات تێکڕای ژیانت کامەرانی‌و ئاسوودەیی‌و بەختەوەری دەبێ‌و عەلمانی‌و ئەلقە لەگوێکانی گاورو جوولەکە ناتوانن لەرێگا لاتبدەن‌و تەغریب‌و تەبەروجت پێ بکەن‌و بتخەنە تەڵەی شەیتان‌و شەرم و شکۆت بڕێژن‌و هەوا ئارەزووی چاوە برسیەکانی خۆیان پێت تێربکەن و وبتکەنە کالایەك و لەبازار لەگەڵ کالاکانی تر بتفرۆشن.

ئەمەش بزانە پێناسەت لەئیسلامدا ئەوەیە تۆ ئافرەتێکی موسڵمانی راستگۆی بەشەرم‌و حەیاو دڵسۆزو ئارامگرو پاك داوێن‌و لەخواترسی وەکو خوشکانی پێشین مریم و ماشیتەو دایکە خەدیجەو عائیشەو خەنساو.. خودا لەهەموویان رازی بێ چاوەرێتن لەبەهەشت.

**وصلى الله على محمد وعلى آله وصحبه أجمعين.**

**هەر خەمخۆرێك حەز دەکات ئەم پرۆژەیە بەردەوام بێ،**
**بۆ هاوکاری با پەیوەندی بکات بە ( ٠٧٥١٥٦٠٣٩٥٧ )**
**مافی چاپ و بڵاوکردنەوەی بۆ هەموو خێرخوازێکە**
**( الدالُ على الخير كفاعله )**

## ناوەرۆك